# خوا ناسی

کاک ئەحمەدی موفتیزادە

وەرگێرانی لە فارسییەوە : سەحەر علی حمە

سەرنج : ئەوەی لە ناو کەوانەکاندان () بۆچونی خۆمە

ئەو وەسیلەی کە ئینسا ن ئەتوانێ خوای پێ  بناسێ چییە؟

وەڵام : ئینسان دوو ئیختیاری هەیە بۆ ناسینی خوا

١-عیلم

٢-قورئان

عیلم : مەبەست ئەو بابەتە تەجروبیانەیە کە ئینسان بە هۆیەوە دلنیایی پەیا ئەکات بە لێکۆلینەوە لە عیلم و دەرکی عیلمی و بەحثی عیلمی ، یارمەتی ئینسان ئەیەن لە ناسینی خوایا.

قورئان : مەجموعەیەک ئایاتی ئیلاهییە کە لە ئیختیاری ئینسانایە.

# تەکامول لە ژیانی ئینسان و ئەنواعی ئینسان

یەکێک لەو مەسەلە موهیمانەی ژیانی ئینسان، تەدریجی بونی، کامڵ بونی ئینسانە.

ئەم کامڵ بونی تەدریجیە فەرد، وە  نەوعی فەرد ئەگرێتەوە

مەبەست لە کامل بونی نەوعی فەرد ، ئەوەیە هەموو ئینسانێک بۆ ئەوەی لە قۆناغی مناڵی دەرچێ و بگاتە مەرحلەیەکی گەورەتر پێویستی بە گەشە کردنوو چەن مەرجێک هەیە بۆ ئەم کامڵ بونی جسمییەی ، وەک  خواردن و خواردنەوەو چەن شتێکی تر.

بەلام مەبەست  لە کامل بونی فەرد کەم بونەوەو لابردنی نەقصەکانیەتی کە هەنگاو بە هەنگاو، وردە وردە ئەبێت تا ئەگاتە نوقتەیەکی گەورەو باڵا و کامڵ( ئەمەش لە رێگەی دەرکی عیلمی و مەعریفەوە ئەبێت).

## بەرەو پێش چون و کامل بونی ئینسان بە دوو شێوە ئەبێت:

١-طبيعی

٢-غیر طبيعی ( ئەمەیان بە هەوڵیانی ئینسان خۆی ئەبێت)

تەکامولی تەبیعی ئینسان وەک تەکامولی حەیوانات و مەوجودات وایە ئەگەر مەرج و شەرایتی بۆ هاتە دی ئەوا ئینسان لە دوای لە دایک بونییەوە لە ژێر سایەیی ئافریندەکەیا ( بەدیهێنەرەکەیا واتە هەموو شتێکی خستۆتە ئیختیاری ئینسان تا گەشەی پێ بکات) ئەبێت بە ئینسانێکی گەورەو کامل.

کاواتە لەم ڕوەوە وەک حەیوانات وایە چونکە حەیواناتیش ئەگەر هەلو مەرجی باش بێت و خواردن و خواردنەوەو پێویستیەکانی هەبێت ئەوا لە قۆناغی مناڵی دەرئەچێت و مەوجودێکی گەورەو کاملێ لێ دەرئەچێت.

بەڵام ئەم شەرایتی تەبیعییە بۆ بەتەدریجی کامل بونی ئینسان بەس نییە چونکە ئینسان خاوەنی (عیلم و فکرە)

کەواتە بۆ کامل بونی ئینسان شەرایتی تەبیعی و غەیرە تەبیعیمان پێوستە
غەیرە تەبیعیەکەی بۆ کامل بونی فکر و عیلم و عەقڵی ئینسانە.

کەواتە دوای تێگەشتن لەم دوو شەرایتە نیازمان بەوە هەیە کە ئەم دوو شەرایتە مسۆگەر بکەین ئەویش بە گەڕانەوەمان بۆ قورئان.

لەپێش ئیسلامدا بە درێژای مێژوو پێغەمبەران هاتون ، عیلم و فکری خۆیان بە خەڵک گەیاننوە ، هەنێک لە قوتابخانە فکرییەکان ملاحەزەی عیلمیان لێ کردوە بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم تطوراتە هەماهەنگ و رێک نەبوە لەگەڵ شەرایتەکان (واتە ئەگەر لەگەل تەبیعییەکەی رێک بوبێ ئەوا جیاوازی هەبووە لەگەڵ غەیرە تەبیعییەکەی وە بەپێچەوانەشەوە) بۆییە هەر زوو لەناو چووە.

بۆ نمونە لە یۆنان لە روی فکر و عیلمەوە بەرەو کامل بون و تطورات ئەرۆشتن ،یان لە شەرق چین و هیندستان بەرەو پێش ئەرۆشتن یان هەنێک لە ئاسارەکانی شارستانیەتی جۆراو جۆر لە هەنێک شوێنی دنیا پێشکەوتنە عیلمییەکانیان ئەبینین بەڵام ئەوەی ئەبێتە هۆی تەکامولٔ و تطوارتی ئینسان بە هەموو شێوەیک مەفع بوو.

دەورەی پێش ئیسلام تەقریبەن دەورانێکی تاریکی بوو ،شتێک قابیلی تطورات و فکر و عیلم لەناو خەڵکا نەبوو ،خەڵک سەرگەرمی شتی بێ سود بوون هەتا قەرنێک پێش ئەوانیش هەر وا بوون.

تەنها شارستانیەتێک لەو رۆژەیا نسبەت بەوانی ترەوە هەبوو بێت ئێران و رۆم بوو.

بەڵام کاتێ بە شێوەیەکی دەقیق سەرنجی ژیانی خەڵک ئەیەین لەو دوو وڵاتەیا بە عینوانی شارستانیەت ئەوا ئەبینین نەک شارستانیەت بەمەعنای ئینسانی و ئەخلاقی نەبوە بەڵکو زۆر وەحشی گەریش بوە چ لە ڕوی عیلمی یان فکری یان ئەخلاقی ،شتێک نابینین بیکەین بە وەسیلەی هەڵسەنگاننی دەقیق ودروستی ئەوان.

لەم زەمەنەیا جەزیرەی عەرەب زۆر زۆر دواکەوتو بوو لە هەموو رویەکەوە،بەڵام باکور و باشوروی جەزیرەی عەرەب کە مستعمەرەی ئێران و ڕۆم بوو وەزعیەتێکی تریان هەبوو، کە ژیانی مەرکەزیەکەی زۆر دوا کەوتو بوو.

وەبەهەمان شێوە باکوری ئەوروپا وەک جەزیرەی عەرەب زۆر دواکەوتو بون لە روی فکری و علمی و ئەخلاقیەوە ،بەڵام بە هۆی هاتنی شارستانیەتی ئیسلامی و خێرا بلاو بونەوەی بە ناوچەکانی تەنیشتیا، بەعەکسی باکوری ئەوروپاوە تاریخێکی ڕۆشن و ئاشکرا لەبارەی جەزیرەی عەرەبەوە لەبەردەستمانایە چونکە شارستانیەتی ئیسلامی زۆر درەنگ بە باکوروی ئەوروپا گەشت بۆیە کتێبی تاریخی و شارستانیەت لەبارەیانەوە کەمە بەم پێیەش ناسینی ئێمە نسبەت بەوان کەم ئەبێتەوە.

بەڵام لەبەرئەوەی ئیسلام لەسەرەتایا مێشک و فکر و ئەندێشەی ئینسانی پەروەردە کرد سەرەنجام ئەمڕۆ ئێمە خاوەنی تاریخێکی ڕۆشنی جەزیرەی عەرەبین.

لەپێشتر وتمان کە جەزیرەی عەرەب بەر لە ئیسلام چەن لە تاریکیا بووە

لەناو ئەمانەیا تەنها دوو گروپ هەبوون کە تارادەیەک لەم تاریکییە دور بون و لە عیلم بەهرەوەر بون ئەوانیش :

١-یەهودیەکان خاوەنی تەورات

٢-هەنێک لەدانایانی مەسیحی کە زیاتر گۆشەگیر بون بۆییە بە روهبان ناویان دەرکردبوو،کە لەبەر فشارەکانی ئیمپراتۆری ڕۆم پەنایان هێنا بوە بەر جەزیرەی عەرەب و ژیانێکی فەقیرانەیان هەبوو، لەناوچە جیاوازەکانی ئەم جەزیرەیا ژیانیان بەسەر ئەبرد.

ئەم دوگروپە لەبەرامبەر خەلکەوە رەوشی جیاوازیان هەبوو،یەهودیەکان هەمیشە خۆپەرست بون و حەسادەتیان بەرامبەر بەوانیتر هەبوو خێریان تەنها بۆ خۆیان ئەویست وە حەزیان ئەکرد میلەتەکانی تر هیچ گەشەکردنێکیان تیا رونەیا ،ئەوەی کە خۆیان ئەیانزانی بۆ خەلکانی تر هەرگیز بەرەوایان نە ئەبینی لەیارمەتییانیان.

وەلە موقابیلی ئەمانا مەسیحیەکان بون کە پەنایان هێنابوە بەر جەزیرەی عەرەب، لەبەر ئەوەی کەسانی بە ئیمان و پاک نییەت بون لە پێیانی بەهرەی خۆیان بە خەلکانی تر درێغیان نە ئەکرد،بەڵام شەرایتی ژیان لە جەزیرەی عەرەب بە شێوەیەک نەبوو کەخەڵکەکەی بیر لەلایەنی عیلمی بکەنەوەو لە زانایانی مەسیح بەهرە ببەن.

خەلکانی عەرەبستان نەلایەنی فکریان هەبوو تا بیر لە عیلم بکەنەوە نە نەوعی ژیانیان بەو شێوە بوو کە ڕوبکەنە لایەنە عیلمیەکان،ژیانیان بریتی بوو لە چەن قەبیلەیەک کە نیازیان لەم سەرزەمینە تەنها ژیانێکی وشک و بێ بەهرە بوو . زۆر کەم بوون ئەو کەسانەی کە خۆیان یان منالّەکانیان بناردایەتە لای ئەم زانایانە بۆ وەرگرتنی بەهرەکانیان، بەڵکو ئەوەی بەلای ئەوانەوە موهیم بوو کەمنالّەکانیان بۆ ئیش و کار رابێنن و بە ژیانی خۆیان بگەن،ئەو نەوعە کەمەشی کە نێرابونە لایان بۆ خوێندن و نوسین دواتر بوبونە مەسیحی و تەنها چەن بەرنامەیەکی فێرکاریان هەبوو کە قابیلی دیقەت و سەرنج نەبوو بۆییە تەئسیراتی لەسەر خەڵک نە ئەکرد.

سەیر ئەکەین لەهەموو رویەکەوە خەڵکانی عەوام بوون و بەرنامەیەکی پەروەردە و فێرکاری لەجەزیرەی عەرەب وجودی نەبوو.

پەروەردگار ئالەم کاتەیا ئیرادەی کرد بەرنامەیەکی کامڵ و دینێکی کامڵ بۆ ژیانی بەشەریەت  بنێرێت :

یەکەم : لەدەورانێکا ناردی کە ئاساری شارستانیەت و تطورات بەشێوەیەکی گشتی مەفع بوو.

دووەم : جامیعەیەکی هەڵبژارد کە هەموو خەڵکی ئەو جامیعە عەوام بوون.

سێییەم : کاتێک سەیر ژیانی پێغەمبەر ئەکەین لەم جامیعە مەحرومەیا لەهەموو کەس زیاتر مەحروم تر بوو.

لەم جامیعەیا تەنها هونەرێک کە باو بووبێ هونەری زمان بووە،هونەری فەصاحەت و بەلاغەت.هەموو ئیستعدادو توانای خۆیان لەوتنی شعرا ئەخستە کار ، بەشێوەیەک شعر گەشەی کردبوو کە بەلاغەتەکەی گەشتبووە چڵە پۆپە.ئەم شعرانە فکری و ئەندێشەیی نەبوون کەلەسەر کاغەز بنوسرێ و کەسێ لێکی باتەوە چونکە کاسانێک نەبوون کە بنوسن یان کەسانی وەها نەبون کەدواتر ئەم بیرو بۆچونانە لەسەر ضمیری خۆی لەسەر ئەو کاغەزە سابت کات،بۆییە شعرەکانیان وەک قەسیدەی درێژ وا بوو (وەک حەیران و لاوک و...هتد) بون.

هونەری شعر بەشێوەیەک رەواجی پەیا کردبوو کە شاعیرەکان دەستیان ئەکرد بە وتنی شعر و کردبویان بە حالەتێکی پێشبرکێ کە دواتر لەلایەن رەخنەگرەوە باشتریانیان لێ هەلئەبژارد و شاعیرەکەش رەواجی زۆری پەیا ئەکرد ،بەم شێوەیە هونەری شعر هونەرێکی میلی و منحصر بوو کە هەموو خەلکی گرتبۆوە.

هەنێک لەو شعرانە وەک (معلقات سبع)، تا ئێستاش ڕەوای ئەوەی هەیە کە لێی بەهرە ببەی ،ئەمە سەرەرای قەصایدەکان،وە چەنەها شعری فراوانی تر هەن کەلەعەرەبەکانی ئەو سەردەمەوە بە دەستی ئێمە گەشتووە.

دانیشتن لە کۆڕی ئەم شعر و شاعیر و رەخنە گرانە کاتی مناسبی ئەویست

هەرکەس ئەم کاتەی هەبوایە ئەیتوانی بەشداری بکات و استعدادی خۆی پشان بات ، بەڵام کەسانێک کە مەحروم تر بون کاتێکی تەواویان نەبوو بۆ ڕۆشتن بۆ ئەم مەجلیسانە و استعدادی کەمتری خۆیان پشان ئەیا.

ئەگەر سەیری ژیانی پێغەمبەر بکەین لە ناو ئەو هەموو خەڵکە مەحرومە لە عیلم، ئەو لە هەمووکەس مەحروم تر بوو تەنانەت لە هونەری باوی ئەو سەردەمەش کە شعر بوو کەمترین بەهرەی نەبوو، ئەو هێشتا لە دایک نەبوبو کە باوکی لەدەست یا،لە دوای ئەوە ئەرکی سەرپەرشتی کردنوو بەخێو کردنی کەوتە ئەستۆی باپیرەی بەڵام لەبەر ئەوەی باپیرەی دەست کورت بوو بۆییە پێغەمبەری ناردە بەر شوانی کردن ،ئیمکاناتی عبدالمطلب بەجۆرێ نەبوو کە بتوانێ نەوەکەی بە بێ کار پێکردنی بەخێو بکات ،شەش ساڵ زیاتر نەبوو کە دایکیشی لەدەست یا.

پاش مەرگی باپیری، ابو طالب(مامی بوو) ئەوی هێنایە لای خۆی،

ابو طالب پیاوێک بوو کە ئەویش لە روی دارای زۆر فەقیر بوو بەم شێوە پێغەمبەر لای ئەویش ئەبوو دەس بەکاری خۆی بکات و نەوەستێ وە کاتێک زیاتر گەورە بوو ناچار بوو کە لە بنەماڵەی ابو

طالب زیاتر کار بکات ، هەموو ئەمانە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە پێغەمبەر لە هەموو هونەرە میلی و گشتییەکان بێ بەش بێت.

هەموو خەڵک کاتی ئەوەیان هەبوو کە ساڵانە بڕۆنە کۆرە شعریەکانەوەو کەم کەم استعدادی خۆیان پەرە پێ بیەن و پشانی بەن.

پێغەمبەر بە جۆرێ ژیانی دژوار بوو ئەو کاتانەی کە لێی ئەمایەوە ئیسراحەتی تیا ئەکرد،مەجالی رۆشتنی بۆ ئەم جۆرە شوێنانە نەبوو.

لە ڕاستیدا ئەم هونەری شعر و شاعیرانە ئەگەر چی هونەرێکی میلی بوو بەڵام زیاتر ئەو کەسانەی ئەگرتەوە کە تارادەیەک ئەشرافی بوون و دەولەمەن و دەسەلات رۆشتوو بون کاتی زیادەیان لێ ئەمایەوە بۆ ئەم نەوعە کارانە بەڵام ئەوانەی کە زۆر فەقیر بون و بەردەوام کاریان ئەکرد، کاتی رۆشتنیان بۆ ئەم نەوعە مەجلیسانە زۆر کەم بوو یان هەر نە ئەرۆشتن، وا دەر ئەکەوێ محمد محرومترین کەسی ئەو رۆژە بووە.

بە بونی ئەم هەموو محرومیەتانە خوای گەورە ئەوی هەڵبژارد بۆ راپەراننی ئەو کارانەی کە ئەبێت خەڵکی لێ بە ئاگا بهێنرێتەوە،وە ئەمە سونەتێکی ئیلاهییە ئەو کەسانەی کە هەلئەبژێرن بۆ راپەراننی کارەکان(وەک پێغەمبەران) بە جۆرێ ژیانیان خۆی موعجیزەیە.

بەراستی لەکەسێک کە چواردە قەرن پێش ئێستا کە بە زمانەکەی خۆی لەباوترین هونەر مەحروم بوو هەموو تەمەنی یەک بەیت شعری نەوتوە چ چاوەروانییەک ئەکرێ ؟ چۆن وەها شەخسێک ئەتوانێ گەورەترین تطورات بهێنێ کە هەم فکری بوو ، سیاسی بو،ئەخلاقی بوو،اجتماعی ...؟ ئایا شتێکی لەم جۆرە بەلای ئینسانەوە قبوڵە ؟

بەڵام لەبەرئەوەی بابەتی ریسالەت خۆی ئیعجازی هەیە بۆییە خوای گەورە مرۆڤی لەم جۆرە هەڵئەبژێرێ( نەک ئەوەی خوا بە ئارەزوی خۆی و بەبێ هیچ شتێ ئەم مرۆڤە هەڵبژێرێ بەڵکوو ئەم مرۆڤە خۆی لە ئەصلدا توانای ئەمەی هەیەو مرۆڤێکی پر مەسولیەت بووە ئامادەی ئەوەی هەبوە ئەگەر چی هیچی نەزانیبێت بەڵام دیارە پر فکر و مێشک کراوە و ئینسان بووە ئەگینا خوا بۆ یەکێ تری هەڵنەبژارد ؟ ..واتە خوا هەر لە خۆوە کار ناکات دیارە ئەم محمدە با زۆر نەزان بوبێ بەڵام دیارە مرۆڤ بوە ،ئینسان بوە هەموو ئەو مەرجی مرۆڤبونەی تیا بووە بۆییە خواش بڕیاری لەسەر یاوە) .

لەبەر ئەوەی ئینسان ناتوانێ شتێکی لەم جۆرە دروست بکات ئەویش ئینسانێ کە بە هەموو شێوەیەک بەو هەموو مەحرومیەتەوە(فکری و عیلمی) . ئێمە لێرەیا ناتوانین هەموو ئایەتەکانی قورئان باس بکەین تەنها هەنێک پیاچونەوەی ئصولی ئەکەین

## پیاچونەوەی هەنێ ئصول

ئینسان بۆ ئیدارەی صحیحی ژیانی فکری و مەعنەوی ،نیازی بە قوانینی مەدەنی و بەرنامەی پەروەردەی فەردی و رێخستنی ئصولی خانەوادەی و سیاسی و اجتماعی و اقتصادی هەیە ،هەموو ئەمانەش هەیە  کە بۆ ژیانی ئینسان پێویستە لە قورئان بە شێوەی مەجموعەیەکی کەمێک زاهیری، لەم دەورانی پەیامبەریەیا خەلک رێگای رشد و تطوراتیان پەیا کردوو رێگایەکی صحیحیان هەڵبژارد.

دەیان و سەدان و هەزاران زانا لە بیر کردنەوەو هەوڵیانا بوون بە درێژای چواردە قەرن بەڵام تا ئێستاش رێگەیان بەشوێنێ نەبرد

نەیان توانی نەقبێکی وەها بگرن لە قورئان کە بەشێوەیکی صحیح لێی بییا.

بەیەقینی ئەتوانین بڵێین کە زانایان و پەروەردەکەران ئەوانەی عیلمی و ئەوانەش کەبەرنامەی پەروەردەکەرن لە دانانی بەرنامەی دروستی ژیان و معنەویەت عاجزن و رێگای صحیحیان نییە.

هەر ژمارەیەک لەجامیعەو قانونی پەروەردەکەران و عالمان ببینین ئەوا سەر بەیەک بەرنامەی بچوکی ئینسانن، بەڵام کاتێ سەیر دینی ئیسلام ( ئەم دینە باوەی ئێستا نا بەڵکو ئەو دینەی کە محمد هێنای کە ئەرزو ئاسمان جیاوازی هەیە لەگەل دینی مەلا و شێخ ..هتد) هەموو ماسائیلە بەشەرییەکان هەر لە پەروەردەی فەردەوە هەتا ئەو قەوانینانەی کە پەیوەندی بەمەسائلی جەمعییەوە هەیە، ئەبینین

ئەم مەسائیلانە ئەونە دژوارن کە هەتا لە دنیای ئەمرۆشدا غەیرە قابیل و باوەڕکردنە، چ بگات بە شەخصێک کە لەهەموو رویەکەوە مەحرومترین کەس بووە.

ئێستا ئەگەر بە نوقتەیەکی زۆر موهیم دیقەت بکەین کەبەرنامەی دین چواردە قەرن پێش ئێستا لەناو ئەو هەموو مەحرومیەتا بە کامڵی دابەزی لە حالێکا هەولی هەموو عالیمان و دانشمەندان بەو هەموو ئیمکانات و وەسائیلە زۆرانەی کە لەئیختیارانا بوو هاورێکن و وەک یەکن ئەوا لە نەتیجەیا سەرت سورئەمێنێ و قابیلی باوەر کردن نابێ ،ئەگەر چی بەشێوەیەکی عادی وا دەرئەکەوێ کە بەرنامەی دانیشمەندان بە بەرنامەیەکی کاملتر لە ئیسلام دەر ئەکەوێ بەڵام کاتێ بەرنامەی سیاسی و ئیقتصادی ئیسلام بەراورد بە هی دانیشمەندان وەرگرین ئەوا ئەو نەتیجەی کە دانیشمەندان بەدەستیان هێناوە نسبەتێکی مەنفی هەیە.

قبوڵکردنی ئەم مەسەلە لە نەظەری عیلم و عەقلی بەشەر جێی باوەر

و قبوڵکردن نییە چۆن مومکینە کەسێک پێش چواردە قەرن بەو شەرایتەی پێشتر باسمان کرد بەرنامەیەکی ئاوا فراوان و دەقیق طرح بکات ؟

تەنها تەفسیر و تەوجیهاتێ کە ئەتوانین بڵێین ئەوەیە کە ئەو

بەرنامەی محمد هێنای و ابلاغی خەڵکی پێکرد  هی خۆی نەبوو بەڵکو هی ئافریندەی بەشەر بوو ، ئەو ئافریندە ئینسانی ناسیوەو

ئیستعدادەکانی زانیوەو نیازەکانی تێگەشتوەو دواتر متناسب بەم نیازانەی ئینسان بەرنامەیەکی لەم شێوەی نارد بۆ ئینسانییەت کە رشد و مەعنەویەت بێت بۆی.

بەرنامەی دین( دینی پێغەمبەران نەک مەزهەب و عولەماو سونە و شێعە و مەلاو شێخ..هتد تەبعەن ئینسان نابێت کەس رەفز بکات یان لە خۆوە بە کەس بڵێ نەزان تا ئەو کاتەی ئاستی زانیارییەکانی خۆی لەوانی تر زیاتر ئەبێت) مایەیی خۆشبەختی و سەعادەتی ئینسانە باشترین بەرنامەیە کە تایبەتە بە ئینسان و بۆ غەیرە ئینسان ( هەموو یاساکانی کەون و گیانلەبەران بەتەواوی لە ژێر کۆنترۆلی خوایان بە پێی سیستمێکی رێکو بەرنامەیەکی تەواو لە ناو ئەم هەموو قەوانینەیا ئینسانی ئازاد کردوە و ویست و عیلم و فکری یاوەتێ تا بەکاری بێنێ و پێی کامل ببێی و پێی ببێ بە ئینسان و لە تەواوی کەون و مەوجوداتی تر جیای بکاتەوە) هیچ بەرنامەیەکی وا مەترەح نییە وەک  دینی ئیسلام بە عینوانی بەرنامەیەکی مەعنەوی بۆ ژیانی ئینسان، نیاز و مەعنەویەتی ئینسان ، بەشێوەیەکی کامڵ

دابین بکات لە ژێر چاودێری ئافریندە کە بەرنامەکەی ناردوە و بە کامڵی ئینسانی ناسیوە لەم ڕووەوە کە ئەو بەرنامەی کە ئەینێرێ موتەناسبە لەگەل ئیستعداد و زانین و تایبەتمەندییەکانی ئینسان ،بەم شێوەیە  چواردە قەرن پێش ئێستا نەک ئینسان بۆ ئینسان ناسراو نەبووە بەڵکو هەتا ئەمرۆشی لەگەل بێ وە داهاتوشی لەگەل بێ

ئینسان ناتوانێ ئینسان بناسێ (تا ئەمرۆش تەنها بەشێکی کەمی لایەنی جسمی ئینسان زانراوە کە ئەویش زۆر کەمە چونکە هەر جسمەکەی لە چەنەها خانە و شانەو خوێن و دەمار ..هتد پێک هاتووە زۆر ئالۆزە ..وە هەتا ئێستاش نازانرێ لایەنی مەعنەویەکەی، رۆحەکەی نەزانراوە) ،کاتێ کەسێکی خاوەن مەعریفە و متعلق بە مەعریفە هەردوکیان خاوەن یەک جنس بن ئاسایی ئەبێ کە یەکتر نە ناسن.

کەواتە ناسینی ئینسان بە وەسیلەی هەوڵیانی ئینسان شتێکی غەیرە مەنطقییە.

ئینسان ئەتوانێ بۆ شتێ بەرنامە دابنێ کە بەتەواوی زانیاری لەسەر هەبێ و هەموو لایەنێکی بزانێ ،هەر لەبەر ئەمەیە کە دانیشمەندان هەر هەوڵێک کە ئەیەن بۆ دانانی بەرنامەیەکی باش بۆ ئینسان دواجار سەرکەوتوو نابن (بەرنامەی ژیان و مەعنەویەتی ئینسان) بەڵام لە موقابیلا ئیسلام سەرکەوتوو بوو.

نوقتەیەکی تری قورئان بەلاغەیتەکەی بوو کە جگە لە مەعناکەی ، زاهیرەکەشی موعجیزە بوو ،هەر وەک پێشتر باسمان کرد کە ئەو زەمەنە هونەری بەلاغەت گەشتبووە چڵەپۆپە لە کاتێکا ئەو کەسەی کە ئەم قورئانەی ئیبلاغ کرد بە خەڵک هیچ پێشینەیەکی لەم هونەرەیا نەبوو.

کاتێ قورئان بە خەڵکی هەر سەردەمێک ئەگات خەڵکی ئەو سەردەمە بۆ قورئان مێشکیان ئامادە ئەبێ ، مەرحەلە بە مەرحەلە بەرەو پێش ئەروات.

خەڵکی چواردە قەرن پێش ئێستا ئەیانتوانی بە باشی دەرکی زاهیرەی قورئان بکەن وەک ئەوەی خەڵکی ئێستا ئەتوانن دەرکی مەعنای قورئان بکەن بەڵام بۆ ئەوان ئەمە نەبوو ،هەرکاتێک داوای مەعنای قورئانیان ئەکرد محمد بە شێوەیەکی رەوانی ئەو کاتە

وەڵامی ئەیانەوە کە بگونجایە لەگەل وەزعیەت و بارودۆخی ئەو کاتەیا.

مەسەلەن جاری وا هەبوو ئەی وت هەنێ مەعنای قورئان هەیە بۆ خەڵکانی سەردەمێک ناتوانن لێی تێبگەن سەردەم تا سەردەم ئەگۆرێ.

یان ئەیوت لەوانەیە دەرکی ئەو کەسەی کە ئامادەیەو گوێ ئەگرێ نسبەت بەناوەڕۆکی مەوزوعەکە لەو کەسەی کە قسەکە ئەکات زیاتر بێت (واتە ئەو کەسانەی کە ئایاتەکان بۆ خەڵک رون ئەکەنەوە لەوانەیە بۆ ئەو کاتە گونجاو نەبێت و بۆ سەرەمی دواتر بێت یان هەدەفی ئەصلی مەوزوعەکە بەباشی نەگەیەنن ئەمەش بە هۆی ئەوەی بەباشی دەرکیان نەکردبێت دواتر ئەو کەسانەی کە ئەیبیستن بەباشی دەرکی ناوەرۆکەکەی ناکەن).

بەم شێوەیە وەڵامی ئەوانی بەم شێوەیە ئەیاوە کە مەعنای ئەم ئایەتە بۆ خەڵکی ئەم زەمەنە نییە کاتی نییە بۆ ئێستا.

لەمانەوە بۆمان رون بۆیەوە کە قورئان لە روی فەصاحەت و بەلاغەتەوە موعجیزە بوو بۆ ئەوان نەک لە روی مەعناوە بۆییە ئەکەوتە پێشبرکێ لە گەڵیان(لەگەڵ بێ باوەران) و داوای هێنانی تەنیا یەک سورەتی لێ ئەکردن کە وەک قورئان بەلاغەتی هەبێت بەڵام نەیان ئەتوانی ،هەتا ئەمرۆشی لەگەل بێ نەیان توانیوە بەڵام ئەمە زیاتر بۆ خەڵکی ئەو کاتە بوو چونکە هونەرێکی زۆر باو بوو زۆر بە باشی لێی تێئەگەشتن.

یەکێکی تر لە نیشانەکانی قورئان ( قورئان بەڵگە نییە تەنها نیشانەیەکە لە نیشانەکەنی بوونی خوایەک کاتێ کۆمەڵێ  نیشانەی

بەهێز کۆبۆوە ئەتوانی قەرار بەی لەسەر ئەو شتە، بەبونی ئەو نیشانە بەهێزانە یان دوا کەوتنی کۆمەڵێ نیشانە) ئایاتی موتەشابیهەن واتە ئەو ئایەتانەی کە تایبەتە بە سەردەمێک لەسەردەمەکان کە لەگەڵ ژیان و گوزەرانی خەڵکا متناسب بێت و بگونجێت خەلکی ئەو سەردەمە فەهمی بکەن بۆ باشتر کردنی حاڵ و گوزەران ( مەسەلەن لە قورئان کاتێ باسی پەرەستنی بت ئەکات ئەو بتانە بە پێی سەردەمەکان ئەگۆرێ کە خەڵک لە بەرژەوەندی خۆی بەکاری ئەهێنێ ،،لەسەردەمی محمد کافرەکانی مەکە پەرستنی لات و عوزا یان بەکار هێناوە تا خەڵکی پێ ئیستحمار بکان کە گوایە ئەمانە راستە خوا نین بەڵام وەک یارمەتی دەرێکی دینی ئەیان پەرستین بۆ ئەوەی لە خوا نزیکمان بکەنەوە ،،ئەمرۆش خەڵک حیزب و دەسەلاتدار وەک بت ئەپەرستن هەر لە رووی سۆز و عەتفەوە تا ئەگات بە رق و کینەو دژایەتی کردن کە هیچ ئیسفادەی بۆ ئینسان بوون نییە .. پیاوی دینیش کراون بە دەم راستی خەڵک گوایە ئەمانە پیاوی خوان و چاکن وە سەبەبیش هەموو خەڵک خۆیەتی چونکە خۆی پێ کەمترە لە خەڵکی حیزبی و دەسەڵاتدار ..وە بۆ پیاوە دینییەکانیش وا ئەزانێت وەک ئەوانی پێ ناکرێ و ناتوانێ ببێتە باشترین ئینسان کە لەشافیعی و حەنبەلی وغەزالی و ..هتد باشتر بێت چونکە تەمەلەو تاقەتی هەوڵیانی نییە).

سێ نیشانەمان باس کرد لە قورئان:

١-بەرنامەیەکی دەقیق کە گونجاوە لەگەڵ ژیانی مەعنەویەتی ئینسانا.

٢-فەصاحەت و بەلاغەت.

٣-موعجیزەی عیلمی قورئان( ئایاتی موتشابیهە ،،گۆرانی سەردەمی ، هەنێک خەڵک قورئان بە فیزیاو کیمیا زیندەوەرزانی تێگەشتوە یان گەردونناسی کە شتێک لە روی عیلمەوە دەر ئەکەوێ خێرا را

ئەکەن ئەڵێن ئەرەوەلا لە قورئانا هەیە نەخێر قورئان عیلمی نییە بەڵکو دروستکەری ئینسانە ئەوەش لەسەروی هەموویەوەیەتی چونکە کە ئینسان دروست بوو شتەکانی تر ئەکەوێتە دەست ئینسان خۆی کە دروستی بکات و بیدۆزێتەوە ئەگەر قورئان باسی شتێکی زانستیش بکات ئەوا لەتەسەوری ئێمەیا زانستییە ئەگینا هەمووی بۆ هەدەفی ئینسان بونە مەسەلەن خوا باسی دروست بونی ئادەم ئەکات ئەمە بۆ لایەنی زیندەوەری نییە بەڵکو بۆ ئەوەیە تۆ بزانی لەچی دروست بوی بۆ ئەوەی خۆت پێ شت نەبێت ،،ئینجا ئەمە باش بزانن کەس ناتوانێ بڵێ بیردۆزی داروین دژی قورئانە یان رێک وەک ئەوە ئەمە لێکۆلینەوەی ئەوێ خۆ هەر وا ئاسان نییە بەس ئەونەی من بزانم دژی نییە هەرچەن ناشڵێم وەک ئەوە تەفاسیلی کەمێ هەیە ناتوانم لێرە باسی بکەم بەڵام ئەگەر پێتان باش بێت خەلقی ئادەمی ناسری سوبحانی بخوێننەوە ئیسفادەی لێ ئەکەن)

بەم سێ نیشانە ئینسان ئەتوانێ پەی بەوە ببات کە خوایەکی تەنها هەیە کە ئەتوانێ بەرنامەیەکی لەم شێوەیە بنێرێ بۆ ژیانی ئینسانەکان.

پێویستە ئەوە بزانین کە باشتیرن نەوعی استدلال بۆ چەسپاننی هەر مەوزوعێ یان مەطلەبێک استدلال بە خودی ئەو مەوزوعە ئەکرێ.

## قسەی کۆتایی

ئەوەی لە پێشتر باسمان کرد ئێستا دوبارە باسێکی لێ ئەکەینەوە پێشتر وتمان دوو رێگا بۆ خوا ناسی هەیە کە عیلم و قورئانە ،کاتێ . ئەم سێ نیشانەی قورئانمان چەسپان ئەتوانین بڵێین خوا مان ناسیوە

(ئەمە هەر وا ئاسان نییە بیر کردنەوە و تێرامانی زۆری ئەوێ هەر بەو شێوە ئاسانە نییە کە مەلا و شێخ و شەرع ناس باسی لێوە ئەکەن چونکە ئەقلی ئینسان لەم بابەتانەیە ئەبێ زۆر بەکار بهێنرێ و بیر کردنەوەی خۆی نەیاتە دەستی کەس بۆ ئەوەی خۆی باشتیرن هەڵبژاردن بکات) ،هەر کاتێک وا تێگەشتین قورئان لەلایەن خوا هاتوە و بە وەسیلەی ئەقڵ و عیلم تێگەشتین کەلامی بەدیهێنەری بەشەرە، ئەو کاتە ئەتوانین بە هۆی قورئان و نوقتەکانییەوە بە دیهێنەری بەشەر بناسین.

بەم شێوەیە قورئان ئێمە بە ئاراستەی بەدیهێنەری بەشەر و حەقایقی جیهانی هەستی رێنمای ئەکات، کاتێک ئێمە قورئان وەک بەرنامەیەکی نێراوی خوا قبوڵ بکەین پێویستە بیکەینە باشترین وەسیلە بۆ ناسینی خوا.

کاتێک بمانەوێ کەسێک بناسین هیچ وەسیلەیەک شک نەبەین لەلایەن ئەوەوە جگە لە قسەکانی، ئەوکاتە باشترین رێگا و ئیعتمادترین رێگا بۆ ناسینی ئەو کەسە قسەکانیەتی.

کەواتە خاڵی جیاکەرەوەی نێوان ئینسان و حەیوانات بۆ دەرکی حەقیقەت دۆزینەوەی راستییەکان بە ئەقڵ و عیلم ئەبێت، کەڕیشەی لە دەرونی هەموو مرۆڤێکا هەیە (تەبعەن دۆزینەوەی حەقیقەت مەبەست پێی هەولیانی ئینسانە بۆ دۆزینەوەی ئەو پرسیار و گومانانەی کە هەیەتی ئەویش بە خوێنەوەو سەرنجیان و تەمەلی نەکردن بە واز هێنان لە دینی تەقلید کە هەر لەمەلاو خەڵک ئەیبیستێ ،،لە کاتێکا هەموو مرۆڤێ پێویستە بە دوای حەقیقەتی دینا بگەرێ بۆ ئەوەی بزانێ چ گەوجاندنێک و ناراستییەک تێکەڵ بەم دینەی ئێستا کراوە ئەوەی حەز بەم حەقیقەتانە ئەکات داوام وایە لەپاڵ ئەو بەرهەمانەی کە ئەیخوێننەوە یان ئەو مەلایانەی کە پێیان سەرسامن یان ئەو عولەمایانەی کە وەک بت ئەپەرسترێن بەرهەمەکانی کاک ناسر و کاک ئەحمەدی موفتیزادە و عەلی

شەریعەتی و عەلی وەردی و مەلای گەورەو سعیدی نورسی و سیدقطب و عبدلکریم سروش و...زۆری تر هەیە بخوێننەوە تا بزانن دنیا چ باسە ،خوای راستەقینە کامەیە،دین کامەیە).

کەواتە زانیمان موهیمترین وەسیلە بۆ ناسینی خوا قسەکانی خۆیەتی ،ئێمە بۆ ناسینی خوا ئەبێت لە قسەکانی خۆیا بە دوایا بگەرێین بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە سەرەتا حەقیقەتی ئەم قسانە بۆ خەڵک رون بکرێتەوە (خەڵک ئەبێت خۆی هەوڵ بۆ ئەمە بات بە ئەقڵ و عیلمی خۆی دەرکی حەقیقەتەکان بکات ) دوای ئەوە بەرەو ناسینی خاوەنی قسەکان بروات.

ئەگەر کەسێ بیەوێ پێش ئەوەی دەرکی حەقیقەتی قورئان بکات ،دەرکی عیبارەتەکانی  قورئان بکات، هەر چەن هەوڵ بات بۆ ناسینی خوا دواجار ناتوانێ بیناسێ چونکە ئەو دەرکی قسەکانی نەکردوە و دەرکی حەقیقەتی قورئانی نەکردوە ئیتر لە کوێ ئەتوانێ خاوەنی قسەکان بناسێ.

(خەڵکانی زۆۆۆر دەگمەن هەن کە دەرکی حەقیقەتی قورئان ئەکەن چونکە خەڵک تەمەڵەو تاقەتی دەرکی حەقیقەتی نییە دواجار لە ناسینی خاوەنی قسەکان بەهەڵەیا ئەچن و نایناسن لە کاتێکا هەموو خەڵک وا تێ ئەگەن خوا ناسن و تاقانە پەرستن ،، وە من بۆ ناسینی خوا تەنیا سەیر ئەم تەفسیرە سادانە ناکەم کە بەراستی هیچ باوەرم پێیان نییە بۆییە پێم وایە ئەبێت سەرلە نوێ تەفسیرێکی تر بۆ قورئان بکەینەوە کە لەگەڵ فیترەت و ئەقلی ئینسان بگونجێ تا مرۆڤ ئازاد بێت و واز لە بتپەرستی و تەفرەقەو تون رەوی بێنێت و کەس کافر نەکرێ چونکە  بە رەئی من ئەم هەموو تەفرەقە و جیاوازی و چەق بەستنی شەرق و ئەم هەموو ئاژاوانە کە بە ناوی دینەوە ئەکرێ بە هۆی تەفسیرە هەڵەکانەوەیە یان حەدیسەکان).

